# چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بەقورئان و فەرموودە



سیحر

پەرکەم

سەرئێشە

سەرەتان

ئێش و ئازار

توڕەیی

موصیبەت

ڕۆماتیزم





نوسینی
عبدالمجید بن عبدالعزیز المانع

وەرگێڕانی
الیاس محمد کوردی

# چارەسەر کردنی نەخۆشیەکان بە قورئان و فەرموودە

نووسینی

عبدالمجید بن عبدالعزیز المانع

وەرگێرانی

دیاری

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿وننزل من القرآن ما هو شفاء ورحمة للمؤمنين﴾

# پێشەکی وەرگێڕ

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وانتم مسلمون﴾. (آل عمران: ١٠٢)

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام ان الله كان عليكم رقيبا﴾. (النساء: ١)

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾. (الأحزاب: ٧٠-٧١).

أما بعد فإن أصدق الحديث كلام الله، وخير الهدى هدي محمد (ﷺ) وشرّ الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

خۆ چارەسەرکردن بەقورئان شەرع دانی پیّدا ناوەو سەلماندوویەتی هەروەها بوویە ری مرۆڤیش ئەمە

دەسەلمێنێ. سەلەفی سالّح و زانایان و شارەزایانی ئیسلام کاریان بەم ڕاستیە کردووە وکاریگەری یەکجار چاکیشی هەبووە. بەڵکو ئەوەندەی گرینگیان داوە بەچارەسەری قورئان ئەوەندە گوێیان نەداوە بەچارەسەریە پزیشکیەکان و لەهەمان کاتیشدا بەتەواوەتی پشت گوێیان نەخستووە.

بەڵام ئیمڕۆ زۆربەی موسوڵمانان ئەمەیان پشت گوێ خستوە و تەنانەت گەرلەلای هەندێکیان باسی ئەوە بکەی قورئان وەك چۆن شیفای ڕۆحەکانی تیایە لەنەخۆشی کوفر وگومڕایی و تاوانکاری، ئاواش شیفای جەستەکانی تیایە. بەلایانەوە زۆر سەیرە ڕەنگە گاڵتەیشیان پێ بێت.

بەڵام ئەوان بێ ئاگان لەو نەخۆشانەی کەهیچ چارەسەرێکی پزیشکی نەیتوانیوە چارەسەری نەخۆشیەکەی بکات.بەڵام کاتێك چەند ئایەتێکی لەقورئانی پیرۆز خوێندۆتەوە خوای گەورە شیفای داون.

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿وننزل من القرآن ماهو شفاء و رحمة للمؤمنين﴾ (الاسراء: ٨٣) واتە: دایدەبەزێنین لەقورئان دا ئەوەی مایەی شیفاو ڕەحمەتە بۆ ئیمانداران.

هەرکەسێ بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکاتەوە. بەجوانی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە قورئان مایەی شیفایە بۆ مرۆڤەکان لەهەموو نەخۆشیەکانیان وەك ئیمامی ابن القیم: (رحمه الله)

دەفـەرمووێ: (قورئـان شـیفایەکی گشـتییە بـۆ هـەموو دەردەکـانیدەروونی و جەسـتەیی ودەردەکـانی دنیاوئاخیرەت)[1].

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانمان دەدات گرینگی بدەیـن بەشـیفای قورئـانی وەك دەفـەرمووێ: (علیکم بالشفائین، العسل والقران)[2]. واتـە: دەست بگرن بـەم دوو چارەسـەریەو شـیفایە کـە هـەنگوین و قورئانـە. هـەروەها دەفەرمووێ: ((خیر الدواء القـرآن))[3] واتـە: (چاکترین دەرمان قورئانە) لەمانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە قورئـانی پیرۆز چەند بەسوودە.

بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنا بین بەم باسەو زیاتر کردەوەی پـێ بکـەین، حـەزم کـرد ئـەم کتێبـە بکـەم بـەکوردی. تاموسولمانانی کوردیش سوود مەندبن بـەم کتێبـە، وەئـەم پێشەکییەم نووسی و فەرموودەکانیم (تخریج) کرد هەروەها هەندێ نەخۆشی کەلەم کتێبەدا باس نەکرا بوون بەقورئان چارەسەر دەکرێ خستوومەتە سەری لەکۆتایی کتێبەکەدا.

---

(١) زاد المعاد (٣/ ١٧٨)ابن القيم.

(٢) رواه ابن ماجة (رقم /٣٤٥٢).

(٣) رواه ابن ماجه (٣٥٠١).

جا پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەوە حەزم کرد ئەم چەند تێبینییە بخەمەڕوو.

١- قورئان بۆ کێ شیفایە: دەبێ بزانین قورئان شیفایە بۆ ئیماندار کەئەو کەسەیە ئیمانی پێی هێناوە و کردەوەی پێ دەکات. ئەمەش لەم ئایەتەدا بەجوانی ڕوون دەبێتەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وننزل من القران ماهو شيفاء ورحمة للمؤمنين ولا يزيد الظالمين الاخسارا﴾ (الاسراء: ٨٣).

واتە: دادەبەزێنین لەقورئاندا ئەوەی مایەی شیفاو ڕەحمەتە بۆ ئیمانداران بەڵام بۆ ستەمکاران تەنها مایەی زیان و دۆڕاندنە. لەم ئایەتەدا خوای گەورە دیاری کرد کە شیفای قورئان تەنها بۆ کۆمەڵێکە. کە ئەوانیش ئیماندارانن. ئەوانەی کار بەقورئانەکەی دەکەن.

بەڵام ئەوانەی باوەڕیان پێی نییە. چۆن قورئان سوودی دەبێت بۆیان لەکاتێکدا ئەوان باوەڕیان پێی نییە و حوکمی پێ ناکەن و هەجریان کردووە[٤].

---

(٤) (ابن القيم) دەفەرمووێ: هەجر کردنی قورئان چەند جۆرێکە هەجر کردنی گوێ گرتنی یان هەجر کردنی ئیمان پێ هێنانی یان هەجر کردنی ئیش پێ کردنی و حوکوم پێ کرنی یان هەجر کردنی بیرلێکردنەوەی پەند لێ وەرگرتنی یان هەجرکردنی خۆ پێ چارەسەرکردنی (عالج نفسك بالقرآن).

٢- هەروەها دەبێ بزانین شیفایەکە زیاد وکەم دەکات بەگوێرەی زیادوکەمی ئیمان و کردەوەی چاکی نەخۆشەکە یان ئەوەی بۆ نەخۆشەکە بەکاری دەهێنێ.

٣- دەبێ یەقینت هەبێ لەوەی کەقورئان شیفا دەدات بە ئیزنی خوا بەهیچ شێوەیەك نابێ گومانت لێی هەبێ کەگومانت پەیدا کرد ئەوا دڵنیابە لەوەی کەمەحروم دەبیت لەشیفایەکەی.

٤- بێ گومان شیفای قورئانی زۆر چاکتر و بەهێزترە لەچارەسەری پزیشکی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دروستە مرۆڤ چارەسەری پزیشکی بەکار بهێنێ.

لەکۆتاییدا داواکارم لەپەروەردگار کەهەرخۆی (شافی)یە شیفای نەخۆشیەکانمان بدات. وەیارمەتیمان بدات بۆ زیاتر خزمەت کردنی قورئانەکەی و ڕوون کردنەوەی بۆ خەڵکی.

**وەرگێر**

٢٠/صفر/١٤٢٢ ك

**سلێمانی**

# پێشەکی نووسەر

الحمد لله الشافي والمعافي، النافع والضار، لاخير الا خيره ولا فضل الا فضله ولارب سواه، له الحكم وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين، اما بعد.

زانستی پزیشکی لەسەردەمی پێش ئیسلام دا تەنها کۆمەڵێ بیروڕای خورافیات و ئەفسانەیی و کۆمەڵێ سیحر و نووشتە و جادووگەری بووە.

وە هەرکەسێ لێکۆڵینەوەی هەبووبێت لەسەر زانستی پزیشکی کۆنەکان: شتی واسەرسووڕهێنەر دەبینێ کە ئەوکاتە بەبارەری خۆیان بە پزیشکیان داناوە.

قورئانی پیرۆز خۆی داوە لەباسە دروست و ڕاست و گرینگەکان لە گرینگی دان بە تەندروستی و پاراستنی لەش هەروەها پاشان ڕێنموویەکانی لەحەلاڵ کردن و حەرام کردنی هەندێ خواردن و خواردنەوە.

وە ووشەی (شیفا) چەندین جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە لەوانە ﴿وننزل من القرآن ماهو شيفاء ورحمة﴾ وە ﴿واذا مرضت فهو يشفين﴾.

وه ئــەوەی بکۆڵێتـــەوه لـــه زانســـتی پزیشـــکیەتی پێغەمبەرایــەتی (الطــب النبــوي) دەبینــێ پێغەمبــەر (ﷺ) بنەماو بنچینەکانی پزیشکی داناوه، بێ گومانیش ﴿وما ينطق عن الهوى إن هو إلا وحي يوحى﴾ (النجم: ٣-٤).

وەلەم نامیلکەیەشدا هەندێ لەو دەرمانانەی تیایە کە لــە قورئــان و ســوننەتی پێغەمبــەرەوه (ﷺ) دەرهێـنراوه، بـۆ چارەسـەرکردنی هــەندێ نەخۆشــی کــه موســڵمان پێویسـتی پـێ ی دەبێت.

هەروەها ڕوقییە کردن[٥] هەرتەنها بۆ خودی مرۆڤەکە نی‌یە بەڵکو موسڵمان دەتوانێ ڕوقیە بۆ خۆی بکات وه بـۆ غەیری خۆی وه خەڵکی تریش دەتوانن بۆی بکەن. وه پیاو دەتوانێ بۆ خێزانەکەی بکات و بەپێچەوانەوەش.

وەبــێ گومـانیش چاکیـەتی و صاڵحیـەتی ئەســەکەش ڕۆڵی هەیە لە زیاتر بەسوود بوونی ڕوقییەکە چونکە خوای گــەوره دەفـەرمووێ: ﴿إنما يتقبل الله من المتقين﴾ (المـائدة: ٢٧) واتــه: (خـوای گــەوره کـردەوه لـه چاکـەکاران و لەخواترسـان

---

(٥) ڕووقیە کردن (الرقیة) لەکوردیدا پێی دەڵێن نووشتە. بەڵام لەبەر ئەوەی کورد هەروا ڕاهاتووه ئەم ووشەیە بۆ مانا خراپەکەی کەسیحرکردنە بەکار دەهێنێ بۆیە حەزم نەکرد بەکاری بهێنم بەڵکو هەر بە ڕوقییە ناوی بهێنم.

وەردەگرێ). وە مەرجە بۆ چارەسەرکردنەکە. هیچ شیرك و تاوانی تیا نەبێت وەك هاوار بردن بۆ غەیری خوا یان سوێند خواردن بەغەیری خوا وە دەبێ بەعەرەبی بێت یان ماناکەی بزاندرێت و تێبیگەیت وە دەبێ باوەڕی وابێت، کەئەم ڕوقییەیە خودی خۆی کاریگەری نیە (واتە دەبێ باوەڕی وابێت کەئەمە هۆکارە و خودا شیفاکە دەدات).

داواکارین لەخوای گەورە سوود بگەیەنێ بە خوێنەری بەڕێزی ئەم نامیلکەیە، وە ئەم هەوڵە کەمەی ئێمەش بەخاڵصی بۆ خۆی وەربگرێ، وە لە تەرازووی چاکەکانمان دا بێت لەڕۆژەی پێی دەگەینەوە.

﴿ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ﴾

**نووســـەر**

**عبد المجيد بن عبدالعزيز المانع**

# ئەو سورەت و ئایەتانەی شەیتان دەردەکەن

## یەکەم: سورەتەکان:

أ/ (خارجە بن صلت) لەمامیەوە دەفەرمووێ: هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بووم بەموسڵمان پاشان گەڕامەوە، بەلای قەومێکدا ڕۆیشتم پیاوێکی شێتیان هەبوو بەزنجیر بەستبوویانەوە کەس و کاری ووتیان بیستوومانە هاوەڵەکەت (واتە پێغەمبەر (ﷺ) بەخێر و بەرەکەت هاتووە، جا ئایا هیچ شتێکت پێ نییە بۆ چارەسەر کردنی ئەمە، منیش سورەتی (فاتیحە)م بەسەردا خوێند چاك بۆیەوە. ئەوانیش لەبەر ئەمە بەرانێکیان پێمدا پاشان هاتمەوە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەم ڕووداوەم بۆی باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((لەغەیری ئەمە هیچی ترت ووت؟)) ووتم: نەخێر. فەرمووی: ((دەبیبە (واتە بەرانەکە) چونکە بەڕاستی بە ڕوقیەیێکی ڕاست و دروست بردوتەوە)) [٦].

---

(٦) رواه البخاري فتح الباري (١٠/٢٠٨).

ب/ سـوورەتی (البقـره): پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ:
((لاتجعلوا بيوتكم مقابر، إن الشيطان يَفرُّ من البيت الـــذي تقرأ فيه سورة البقرة))[٧].

واته: ((ماڵەكانتان مەكەن بەگۆڕستان. چونكه شەيتان لەوماڵە ڕادەكات. كەسوورەتی (البقره)ی تیا دەخوێندرێت )).

ج/ سـوورەتی (الاخـلاص) و (المعوذتـين) لـه (عقبـة بــن عـامر) دەفـەرمووێ: لەوكاتـەی مـن جڵـەوی ووشـترەكەی پێغەمبـەر (ﷺ) گرتبوولەيـەكێ لەغـەزاكان فـەرمووی ((ئـەی عوقبه بڵێ)) منيش گوێم لێی گرت. پاشان فەرمووی ((ئەی عوقبه بڵێ)) منيش گوێم لێی گرت. پاشان بۆ جاری سـێيەم دووبارەی كردوە. منيش ووتم چـی بڵێم؟ فەرمووی: ((قل هو الله أحـد )) سـوورەتەكەی خوێنـدەوە تاكۆتاييەكـەی پاشـان ((قل أعوذ برب الفلق))ی خوێنـدەوە. تاتـەواوی كـرد. پاشـان فەرمووی هيچ كەسێك نەپارێزراوە بەشتێك لەمە چاكتر[٨].

---

(٧) رواه مسلم (١/٥٣٩).

(٨) اخرجه البيهقي (٣/٣٩٥).

د/ قورئان هەمووی شیفایە: ئەوسورەتانەی، موژدەی بەهەشتو هەرەشەی چوونە دۆزەخی تیایە یان باسی جنۆکەو شەیتانەکانی تیایە کاریگەری هەیە بۆدەرکردنی شەیتانو جنۆکەکان بەئیزنی خوا، بەتایبەتی لەوکاتانەی دەچنە ناولەشی مرۆڤەوە.

وەسورەتی (المؤمنون، یس، الصافات، الدخان، الجن، الحشر، الزلزلة، القارعة، الکافرون) وەچەند سورەتێکی تر.

## دووەم: ئایەتەکان

ا/ ﴿وإما ینزغنك من الشیطان نزغ. فاستعذ بالله انه هو السمیع العلیم﴾ (فصلت/ ٣٦).

## ب/ ئایەتی کورسی:

((وەك هاتوە لەڕووداوی ئەو پیاوەی دزی لەزەکاتی ڕەمەزان ددکرد. ابوهریرة (ﷺ) گرتی ئەویش پێی ووت، ڕێگەم بدە چەند ووشەیەکت فێربکەم. کەسوودت پێ دەگەیەنێ. ووتی: ئەو ووشانە چین؟ ووتی: کاتێك دەچیتە سەر جێگەی خەوتن. ئایەتی کورسی بخوێنە ﴿الله لا اله الا هو الحی القیوم﴾ تاکۆتایی ئایەتەکە. ئەگەر ئەمەت کرد ئەوا بەردەوام لە (حفظی) پەروەردگاردا دەمێنیتەوە. وە شەیتان

لێت نزیك ناكەرێتەوە تا بەیانی. ئەوكاتە (أبوهریرة) ڕێگەی پێدا بڕوات))

(أبوهریرة) ئەم ڕووداوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ((ڕاستی‌پێ ووتی. هەرچەندە خۆی زۆر درۆزنە، جادەزانێ ئەوە كێ بوو سێ‌شەوە قسەت لەگەڵیدا دەكرد ئەی (أبو هریرة)؟ ووتی: نەخێر فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو))[9].

## ج/ دوو ئایەتەكەی كۆتایی سورەتی (البقرة):

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((من قرأ بالآيتين من سورة البقرة في ليلة كفتاه))[10] واتە: هەركەسێ دوو ئایەتەكەی كۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنێت بەسە بۆی (واتە بۆ پاراستنی).

## د/ ئایەتەكان هەمووی شیفایە:

ئەو ئایەتانەی مژدەو هەڕەشەی تیایە یان باسی ئاگرو جنۆكەو شەیتانەكانی تیایە. كاردەكاتە سەر جنۆكەكان‌و دەریان دەكات بەئیزنی خوا بەتایبەتی كەدەچنە ناولەشی مرۆڤە.

---

(9) اخرجه البخاري.

(10) البخاري مع الفتح ٩٤/٩ ومسلم ٥٥٤/١.

١- چوار ئایەتی سەرەتایی سورەتی البقرة (١-٤).

٢- دوو ئایەت لەناوە ڕاستی (البقرة) (١٦٣-١٦٤).

٣- ئایەتی کورسی و دوو ئایەت لەپاش ئەو (٢٥٥-٢٥٧).

٤- سێ ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة) (٢٨٤-٢٨٦).

٥- چوار ئایەتی سەرەتایی سورەتی (ال عمران).

٦- ئایەتی هەژدە لەسورەتی (ال عمران).

٧- سێ ئایەت لەسورەتی (الأعراف) (٥٤-٥٦).

٨- چوار ئایەتی کۆتایی سورەتی (المؤمنون) (١١٥-١١٨).

٩- ئایەتی سێ لەسورەتی (الجن).

١٠- دە ئایەتی سەرەتایی سورەتی (الصافات) (١-١٠).

١١- چوار ئایەتی کۆتایی سورەتی (الحشر) (٢١-٢٤).

١٢- چوار ئایەت لەسورەتی (الرحمان) (٢١-٢٤).

١٣- دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (القلم) (٥١-٥٣).

جا هەر کەسێ ڕوقیە کردنی بەم سورەتو ئایەتانە تاقی کردبێتەوە. دەزانێ قورئانی پیرۆز تاچ ڕادەیەك نەخۆشیەکان چارە سەر دەکات.

وە ئەو نەخۆشیانەی ئەمڕۆ- زانستی پزیشکی- دەستە وەستانە لەچارەسەرکردنی وەك شێرپەنجە (السرطان)و نەزۆکی و غەیری ئەمانەش. ئەم دوعایانە بۆ

لەناو بردنی ئەم نەخۆشیانە چەکێکی چاکە چەکێك بەچەکدارەوە.

* إبن القيم- رحمه الله- دەفەرموێ: ((هەر کەسێ قورئان شیفایی نەدا خوا شفای نادات. وە هەر کەسێ پشت بەخوا نەبەستێ. خودا پشتی دەشکێنێ)).

هەروەها دەفەرمووێ:((جارێکیان لەمەککە بووم.نەخۆش کەوتم. وە نەپزیشکێك وەنە دەرمانێکم دەست نەکەوت)). هەرخۆم چارەسەری خۆم دەکرد، بەخوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) جادەمبینی کاریگەریەکی سەیری هەبوو ئەچووم هەندێ ئاوی (زمزم)م دەهێناو بەسەریدا، چەند جارێك دەم خوێندەوە پاشان دەمخوارد، بەتەواوەتی چاك بوومەوە پاشان بۆ زۆربەی نەخۆشیەکانم هەر ئەمە بەکار دەهێنا. کەبە تەواوەتی سوودم لێ ی وەردەگرت. وە ئەوانەی دەهاتنە لام بۆچارەسەری نەخۆشی، ئەم چارەسەرەم بۆیان دادەنا و زۆر بەخێرایی چاك دەبوونەوە.

# ویردەکانی بەیانیو ئێواران

## (أذكار الصباح والمساء)

### یەکەم: ئایەتەکان:

ئایەتی کورسی (البقرة/٢٥٥): بەیانیان و ئێواران ﴿الله لا إله إلا هو الحي القيوم........﴾.

دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة): ﴿آمن الرسول بما أنزل إليه....﴾ تا ﴿فانصرنا على القوم الكافرين﴾ تەنها بەئێواران لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ((هەرکەسێ دوو ئایەتەکەی سورەتی (البقرە) بخوێنێ لەشەوێکدا بەسیەتی (واتە بۆ پاراستنی) ))[11].

ئەگەر بلێی ﴿قل هو الله أحد﴾، ﴿قل اعوذ برب الفلق﴾، ﴿قل أعوذ برب الناس﴾ (سێ جار) (واتە ئەم سێ سورەتە بخوێنی) ئەوا بەسە بۆپاراستنت لەهەموو شتێك.

---

(١١) رواه البخاري (٥٠٠٩) ومسلم (٢٥٥).

## دووەم: فەرموودەكان:

* ((هەركەسێ لەهەموو ڕۆژێكدا لەبەیانیان و ئێواراندا بڵێت (حسبي الله لاإله الا هو علیه توكلت وهورب العـرش العظیم)[١٢]. (حەوت جار) خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەكات ئەو كارانەی پێویستیەتی)) لەكاری دنیاو ئاخیرەت.

* هەر بەندەیەك لەبەیانی هەموو ڕۆژێك و لەئێوارەی هەموو شەوێك بڵێت (بسم الله الذي لایضر مع اسمه شيء في الأرض ولافي السماء وهو السمیع العلیم) (سێ جار). واتە: (بەناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگەیەنێ نەلەزەوی و نەلەئاسمان دا و ئەو خوایە بیسەر و زانایە) هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێ (انشاء الله). وەلەڕیوایەتی ابوداود (قەد لەناكاو تووشی بەلا نابێ)[١٣].

* هەربەندەیەكی موسوڵمان لەبەیانی و ئێواران دا سێ جار بڵێت ((رضیت بالله رباً وبالاسلام دینا. وبمحمـــد

---

١٢) رواه ابن السني في عمل الیوم واللیلة برقم (٧٢) ص (٣٧) وابو داود (٤/٣٢١) واسناده جید.

(١٣) اخرجه ابو داود (٣٢٣/٤) والترمذي (٦٥/٥) وابن ماجة واحمد انظر صحیح ابن ماجة (٣٣٢/٣) وصحیح الترمذي (١٤١/٣) وحسن اسناده العلامة ابن باز في تحفة الاخیار ص (٣٩).

(ﷺ) نبياً ورسولاً))[١٤] واته: (ڕازيم كه (الله) پەروەردگارم بێ و ئيسلام دين و بەرنامەم بێت و موحەممەديش (ﷺ) كەپێغەمبەرم بێت) ئيلا حەقە لەسەر خودا لەڕۆژی دوايی ڕازی بكات.

* پێغەمبەر (ﷺ) حەسەنو حوسێنی دەپاراست بە((أعيذكما بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة)) واته: (پەناتان دەدەم بەووشە تەواوەكانی خوا، لەهەموو شەيطان و گيان لەبەر و زيندەوەرێكی زيان بەخشی خاوەن ژەهر، وەلەهەموو چاوێكی لۆمە كراو پيس).

وەدەفەرمووێ: ((باوكتان (واته إبراهيم (عليه السلام)) ئيسماعيلو ئيسحاقی بەم دووعايە دەپاراست))[١٥].

* پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: گەورەترين داواكردنی لێ خۆش بوون (سيد الاستغفار) ئەوەيە ((اللهم أنت ربي لاإله الا أنت خلقتني وأنا عبدك وأنا على عهدك ووعدك ماآستطعت أعوذبك من شر ماصنعت أبوء لك بنعمتك علي

---

(١٤) رواه الطبراني باسناد حسن كما في الترغيب (٢٢٩/١) انظر السلسلة الصحيحة (ج ٦) رقم (٢٦٨٦).

(١٥) رواه البخاري.

وأبوء بذنبي فاغفر لي فأنه لايغفر الذنوب إلا أنت))[١٦] واته:
(خوایه تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگەلەتۆ، بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم ومن لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم و بەتۆم داوە تابتوانم، پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی دروستت کردووە، دان ئەنێم بەنیعمەتەکانتدا لەسەرم و دان ئەنێم بەگوناهەکانم دا، لێم خۆشبە بەڕاستی کەس لەگوناه خۆش نابێ جگە لەتۆ) (جاهەرکەسێ ئەمە بخوێنێ کاتێك ئێوارەی بەسەردا دێت و لەوشەوە بمرێت. ئەوا دەچێتە بەهەشت).

* ((اللهم إني أسألك العافية في الدنيا والاخرة. اللهم إني أسألك العفو والعافية في ديني ودنيايوأهلي ومالي، اللهم أستر عوراتي وآمن روعاتي، اللهم أحفظني من بين يدي ومن خلفي وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي وأعوذ بعظمتك أن أغتال من تحتي))[١٧].

* ئەگەر هەر یەکێك لەئێوە بەیانی کردەوە بابڵێت ((اللهم بك أصبحنا وبك أمسينا وبك نحيا وبك نموت وإليك النشور)) واتە: (خوایە بەناوی تۆوە بەیانیمان

---

(١٦) رواه البخاري (٧/١٥٠).

(١٧) رواه ابن ماجه (صحيح ابن ماجه ٣٣٢/٣).

* ئەگەر هەر یەکێك لەئێوە بەیانی کردەوە بابڵێت ((اللهم بك أصبحنا وبك أمسينا وبك نحيا وبــــك نمــوت واليــك النشــور)) واتە: (خوایە بەناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و ئێوارەمان بەسەردا هاتوو بەناوی تۆوە دەژیم و زیندوو بومەوە بۆلای تۆیە) وەکاتێك ئێوارەهات بڵێی ((اللهم بك أمسينا وبك نحيا وبــك نمــوت واليــك المصير))[18].

* کاتێك ئێوارەهات. بڵێ ((أمسينا وأمسى الملــــك لله والحمدلله ولا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك ولــــه الحمد وهو على شيء قدير، رب أسألك خير مافي هـــــذه الليلة. وخير مابعدها وأعوذ بك من شر هذه الليلة وشـــرما بعدها، رب أعوذبك من الكسل وسوء الكبر رب أعوذبـك من عذاب في النار وعذاب في القبر)) وەئەگەر بەیانی هات بڵێیت ((أصبحنا واصبح الملك لله .....))[19].

---

(١٨) رواه الترمذي (صحيح الترمذي ١٤٢/٣).

(١٩) رواه مسلم (٢٠٨٨/٤).

* هەر کەسێ بڵێت لەکاتی بەیانی یان ئێوارە ((اللــهم أصبحت أُشهدك وأشهد حملت عرشك وملا ئكتك وجميــع خلقك، إنك أنت الله لاإله الا أنــت وأن محمــداً عبــدك رســولك)) هەرکەسێ (چوارجار) بیڵێت خودا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەکات[٢٠].

* هەرکەسێ بەیانی یان ئێوارەهات بەسەریداو وتی((سبحان الله وبحمــده)) (سەدجار). ئەوا بۆ ڕۆژی قیامەت هیچ شتێکی لەمە چاکتر ئامادە نەکردووە. ئیلا یەکێك وەکو ئەوەی ووتبێت یان لەوەزیاتری وتبێت[٢١].

* ((سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضا نفسه وزنــة عرشه ومداد كلماته)) سێجار تەنها بەبەیانیان[٢٢].

---

(٢٠) اخرجه ابو داود (٤/٣١٧) والبخاري في الأدب المفرد برقم (١٢٠١) والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٩)؛ وابن السني برقم (٧٠) وحسن سماحة الشيخ ابن باز إسناد النسائي وابي داود في تحفة الأخيار ص (٢٣).

(٢١) رواه مسلم (٤/٢٠٧١).

(٢٢) رواه مسلم (٤/٢٠٩٠).

* هەر کەسێ بڵێت ((لاإله إلا الله وحده لاشريك لـــه، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قديـــر)) (دە جار). وەك ئـەوە وايەكـە چـوار کەســی ئـازاد کردبـێ لەنــەوەی ئیسماعیل[٢٣].

* ((أعوذ بكلمات الله التامات مـــن شـــر مـــاخلق)) (سێ جار)[٢٤]. واتـە: (پـەنا ئـەگرم بە ووشـە تـەواوەکانی خـوا لەخراپەی دروست کراوەکان).

---

(٢٣) رواه النسائي انظر صحيح الترغيب (٢٧٢/١) والسلسة الصحيحة (١١٣).

(٢٤) رواه الترمذي (صحيح الترمذي (٢٨٧/٣).

# چارەسەری سیحر
# فتوایەکی شێخ عبدالعزیز بن باز

- رحمه الله -

## یەکەم: پێناسەی سیحر:

لەزمانەوانیدا. هەموو شتێکی وورد و بچووك و نادیار و هۆکارەکانی دیارنین.

لەشەرعیشدا: ابو محمد المقدسی(رحمه الله) دەفورمووێ: (سیحر: بریتی‌یە لەچەند نووشتەو گرێیەك کە کاردەکاتە سەردڵ و دەروونی خەڵکی و تووشی نەخۆشی و کوشتن دەکات وەنێوانی ژن و مێرد تێك دەدات) وەبۆچونی (ئەهلی سوننەو جەماعە) ئەوەیە کە سیحر ئەصلی هەیە وراستە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ﴾ (النفاثات) یش ساحیرەکانن.

## دووەم: خۆپاراستن لەسیحر:

پێویستە لەسەر موسڵمانان خۆی بپارێزێ و خۆی شوورەدار بکات بە زیکر و وێردە شەرعیەکان وەدوعاکانی خۆپاراستن لەهەموو بارێکەوە. چونکە بەڕاستی ئەمە قەڵایەکی سەختەو زرێیەکی ئەستورە.

شێخ بن باز (رحمه الله) دەفەرمووێ: ئەم دوعایانەی خۆپاراستن و وێردە شەرعیەکان لەچاکترین و گەورەترینی هۆکارەکانی خۆپاراستنە لەشەڕی سیحرو غەیری ئەویش لەشەڕو خراپەکان، بۆ ئەوکەسەی بەردەوام دەبێت لەسەری و دەیپارێزێ و بەڕاستگۆیانە و بەباوەڕ بوون و متمانە کردنەوە بەخواو پشت بەستن و سنگ فراوانی و دڵ خۆش بوون بەم دوعایانە دەڵێت. هەروەها ئائەمانە لەگەورەترین چارەسەریەکانن.

## سێیەم: چارەسەر کردنی سیحر:

### أ/ ڕوقیەو دوعاکانی پاراستن:

شێخ عبدالعزیز بن باز (رحمه الله) دەفەرمووێ: (لەبارەی چارەسەر کردنی ئەو نەخۆشیەیانەی کە بەهۆی سیحرەوە دروست دەبێت: پێغەمبەر (ﷺ) ڕوقیەی بۆ هاوەڵانی دەرکردو دەیفەرموو: ((اللهم رب الناس، اذهب البأس، اشف انت الشافي لاشفاء الا شفاؤك، شفاءً لايغادر سقماً))[٢٥].

---

(٢٥) رواه البخاري فتح الباري (١٠/٢٠٦) ومسلم (٤/١٧٢١).

هـەروەها لەوانـە: ڕوقیەکردنەکـەی جـبریل (عليه السلام) بـۆ پێغەمبەر (ﷺ) ((بسم الله أرقيك من كل شيء يؤذيك ومـن شر كل نفسٍ أوعين حاسد، الله يشفيك بسم الله أرقيـــك)) وەبا سێ‌جار دووبارەی بکاتەوە[٢٦].

## ب/ دەرهێنانی سیحرو پووچەڵ کردنەوەی:

وەشێخ (ابـن بـاز) دەفــەرمووێ: (وەهــەوڵ ئــەدات بـۆ زانینی شوێنی سیحرەکە لەزەوی یان چیا یان غەیری ئەمانە ئەگەر زاندراو دەرهێندراو لەنێو بردرا. ئەوا سیحرەکە بەتاڵ دەبێتەوە). وەلە ڕیوایەتێکی ئیمام بوخاری ((کەوا پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای بیرەکە و جادووەکەی دەرهێنا)).

## ج/ چارەسەر کردن بەخورمای (العجوة):

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((من تصبح بسبع تمــراتٍ عجوة لم يضره ذلك اليوم سُم ولا سحر))[٢٧].

(العجوة)یش: چاکترین جۆرەکانی خورمایە لەمەدینە.

---

(٢٦) رواه مسلم (١٧١٨/٤).

(٢٧) في الصحيحين من حديث سعد بن ابي وقاص (رضي الله عنه).

الخطابي دەفەرمووێ:(ئەگەر (عجوة) ڕێگر بێت لەزیان کەیاندنی ژەهرو سیحر بەمرۆڤ. لەبەر بەرەکەتی دوعای پێغەمبەرە (ﷺ) نەك لەبەر تایبەتیەك لەخورمادا).

د/ چارەسەر کردن بەبەکارهێنانی کەڵەشاخ (الحجامە):

کەئەویش جۆرێکە لەجۆرەکانی تیمار کردن. إبن القیم (رحمە اللە) باسی کردووە.

دەفەرمووێ: (وەبەکار هێنانی (کەڵەشاخ) لەچاکترین چارە سەریەکانە. بۆئەو شوێنەی کەسیحرەکەی بەرکەوتووە) ئەگەر بەشێوە ڕاستەقینەکەی خۆی بەکار هێندرا.

دەشوات وەئەگەر پێویستی کرد چەند جارێك ئەمە دووبارە کرایەوە هیچی تیانی‌یە تاکو دەردەکە نامێنێ.

* هەروەها ئەم چارەسەرە بەسوودە، بۆ ئەو کەسەی بەستراوەتەوە لەچوونەلای خێزانی، هەر تەنها بەوەهم یان دەترسێ لەبەر هەر هۆیەك بێت، کەپێی وابێت ناتوانێ کۆبێتەوە لەگەڵ خێزانەکەی هەتا ئەو وەهمە زیاد دەکات و لەدوا جاردا دەبێتە ڕاستی جاقەت نەکەی بچێت بۆلای فاڵچی و جادووگەران کەچەند قسەیەك دەکەن مانای نازاندرێت.

شێخ (ابن باز) دەڵێت: (وەهەرچی چارەسەر کردنیەتی بەچوونەلای ساحیران، کەخۆنزیك خستنەوەیە لەجنۆکە بەسەر برین و قوربانی دان بۆیان و غەیری ئەمانە ئەوا دروست نی‌یە، چونکە لەکردەوەی شەیتانە، بەڵکو لەشیرکی گەورەیە، واجبە ئاگاداربیت لەمە).

# چارە سەرکردنی ئەو کەسەی بەستراوەتەوە لەچوونەلای خێزانەکەی

## (واتە: بەسیحر لێ کردن)

ئەوەش قورسترین و ناخۆشترین جۆرەکانی سیحرە (پەنابەخوا) وە لەهەموویان زیاترشیان بەئازارترو بەعەزاب ترە.

(شێخ إبن باز) دەڵێت: (دەبێ- واتە ئەم کەسە- حەوت گەڵای سەوزی داری نەبەق (الشدر) بهێنێ و بیکوتێتەوە بەبەرد یان هەر شتێکی تر، وەبیکاتە ناوجامێکەوەو ئاوی بەسەر دابکات ئەوەندەی کەبەشی خۆشۆردنی دەکات وەئایەتی کورسی تیادەخوێنێت و (قل یاأیها الکافرون) و (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس) وە ئایەتەکانی سیحر لەسورەتی الاعراف (١١٧-١٢٢)

وە ئایەتەکانی سورەتی (یونس) (٧٩-٨٢).

وە ئایەتی سورەتی (طه) (٦٥-٦٨).

جا لەدوای خوێندنەوەی ئەوانەی باسمان کرد لەئاوەکەدا. هەندێکی لێ دەخواتەوە. وەبەئەوەی تری خۆی

دەشوات وەئەگەر پێویستی کرد چەند جارێك ئەمە دووبارە کرایەوە هیچی تیانیﻳە تاکو دەردەکە نامێنێ.

* هەروەها ئەم چارەسەرە بەسوودە، بۆ ئەو کەسەی بەستراوەتەوە لەچوونەلای خێزانی. هەرتەنها بەوەهم یان دەترسێ لەبەر هەر هۆیەك بێت، کەپێی وابێت ناتوانێ کۆبێتەوە لەگەڵ خێزانەکەی هەتا ئەو وەهمە زیاد دەکات و لەدوا جاردا دەبێتە ڕاستی، جاقەت نەکەی بچیت بۆلا فاڵچی و جادوو گەران کە چەند قسەیەك دەکەن مانای نازاندرێت.

شێخ (ابن باز) دەڵێت: (وەهەرچی چارەسەر کردنیەتی بەچوونەلای ساحیران. کەخۆنزیك خستنەوەیە لەجنۆکە بەسەر بڕین و قوربانی دان بۆیان و غەیری ئەمانە ئەوا دروست نیﻳە، چونکە لە کردەوەی شەیتانە، بەڵکو لەشیرکی گەورەیە، واجبە ئاگاداربیت لەمە).

# چارەسەر کردنی تووش بوون بەچاوپیسی (العین)

## ١- پێناسەی چاوپیسی و نیشانەکانی:

(الحافظ إبن حجر العسقلاني) (رحمه الله) دەفەرمووێ:

(چاو پیسی سەیرکردنە بەسەر سورمانەوە و بەحەسەدەوە لەلایەن نەفس پیسێکەوە، کەبەمەش زیان بەبینراوەکە دەگەیندرێت).

## نیشانەکانی:

ماندوو بوون و هیلاکیەکی زۆر، سنگی تەنگ دەبێت و ئێش و ئازار لەپشت و هەردوو سەرشان، سەرئێشە، خەوالّوو بوونێکی بەردەوام، ڕشانەوە و لەدەست دانی ئارەزوو (الشهية) قورسی لەش و سەر.

## ٢- خۆپاراستن لە چاوپیسی:

أ- خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ولولا إذ دخلت جنتك قلت ماشاء الله لا قوة إلا بالله﴾ (الكهف: ٣٩)

ب- زۆر خوێندنی سورەتی(الفلق) و (الناس) {المعوذتين} وە سورەتی (الفاتحة) و ئایەتی (کورسی).

ج- ((أعوذ بكلمات الله التامات من شر ماخلق)).
((أعوذ بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامّة، ومن كل عين لامة))[٢٨].
((أعوذ بكلمات الله التامات التي لايجاوزهن بر ولا فاجر من شر ماخلق وبرأ، وذرأ، ومن شر مانزل من السماء، ومن شر مايعرج فيها، ومن شر ماذرأ في الأرض، ومن شر مايخرج منها، ومن شر فتن الليل والنهار، ومن شر كل طارق إلا طارقاً يطرق بخير يارحمن))[٢٩].

د- داپۆشینی چاکە و باشیەکانی ئەوکەسەی لێی دەترسێ کە چاو پیسی لێی بدات. وەك (عثمان بن عفان ﷺ) دەفەرمووێ: (دَسِّموا نونته) واتە: (ئەو چالاّییەی لە

(٢٨) رواه البخاري (١١٩/٤).

(٢٩) رواه احمد (٣/ ٤١٩) وصحيح اسناده عبدالقادر الأرناؤوط في تخرجه للطحاوية (ص/١٢٢).

چەناگەی ئەو منالەدایە ڕەشی بکەن) نەوەك تووشی زیانی چاوپیسی بێت.

ئەگەر چاوپیسەکە (العائن) نەناسرا، دەگەڕێتەوە بۆ ڕوقیە و دوعا شەرعیەکان (ئەو ڕوقیە و دوعایانەی لە خۆپاراستن لەچاو پیسی باسکران).

وە ڕوقیەکەی جبریل (عليه السلام) ((بسم الله أرقيك، من كل داء يؤذيك، من شر كل نفس أوعين حاسد الله يشفيك بسم الله أرقيك))[30].

وە ((بسم الله يبريك، من كل داء يشفيك، ومن شر حاسد إذا حسد ومن شر كل ذي عين)).

وە ((اللهم رب الناس اذهب البأس، وأشف أنت الشافي لاشفاء إلا شفاءك، شفاءً لايغادر سقماً))[31].

---

(٣٠) اخرجه الترمذي وحسنه النسائي.

(٣١) تەخریج کراوە.

# چارەسەر كردنی پەركەم (الصرع)

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿الذين يأكلون الربا لا يقومون إلا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس﴾

## یەكەم: جۆرەكانی پەركەم:

پەركەمێكی ئاساییە، دەرەنجامی بەركەوتنێكە لە سەر، یان بەهۆی سەرما و بارانەوەیە؛ یان غەیری ئەمانەش. جائەم جۆرە چارەسەر دەكرێت بە زانستی پزیشكی و دوعا كردن و پاڕانەوە لەخوا.

وە لەوانەیە ((پەركەمی ئافرەتە ڕەش پێستەكە كەهات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ). پێغەمبەریش (ﷺ) سەر پشكی كرد لەنێوان سەبرگرتن و چوونە بەهەشت یان دوعا كردن بۆ چاك بوونەوەی، ئافرەتەكەش سەبر و بەهەشتەكەی هەڵبژارد وە پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ كرد قەت لەبەر چاوی خەڵك تووشی ئەم حاڵەتە نەبێ)). ابن القیم (رحمە الله) وا دەفەرمووێ.

## دووەم: پەرکەم بەهۆی جنۆکەوە، ئەمانەش هۆیەکانیەتی بەکورتی:

١- جنۆکەیەکی پیاو مرۆڤێکی ئافرەتی خۆش بوویێت، یان جنۆکەیەکی ژن مرۆڤێکی پیاوی خۆشبوویێت.

٢- زوڵم کردنی مرۆڤەکە لە جنۆکەکەوەک پرژاندنی ئاوی گەرم بەسەریا، یان کەوتنە سەری لە شوێنێکی بەرزەوە و غەیری ئەمانەش بەبێ (بسم الله) ووتن.

٣- زوڵم کردنی جنۆکەکە لە مرۆڤەکە، وەک ئەوەی دەستی لێ بوەشێنێت بەبێ هۆ، ئەمەش بۆی ناکرێ تەنها لەم چوار حاڵەتەدا نەبێ:

أ- تورەبوونێکی زۆر.

ب- ترسێکی زۆر.

ج- نقوم بوون لەناو شەهەوات و ئارەزووەکان.

بێ ئاگا بوونێکی زۆر[٣٢]

---

(٣٢) واتە: ئەگەر مروڤ ئەم حاڵەتانەی بەسەردا بێت ئەوا شەیتان زەفەری پێ دەبات.

## نیشانەکانی:

١- لەخەودا: عارەقە کردن، پەشێوی، خەوی زۆر ناخۆش (کابوس) (ئاه) و (ئۆه) کردن لەخەودا، لەخەودا دەبینێ لە شوێنێکی بەرزدا دەکەوێت، خۆی ببینێ لە گۆڕستانێك یان مەزبەلەیێك یان ڕێگایەکی چۆڵ و تاریك و هاوشێوەی ئەمانە.

٢- لەبەخەبەربوون: سەرئێشەیەکی بەردەوام بەبێ هۆیەك لە ئەندامەکانی، دوور کەوتنەوە لە زیکری خوا، خەیاڵ و فکر ڕۆیشتن، تەمبەڵی و خاوی و بێتاقەتی، ڕەق بوونی دەمارەکان، ئێش و ئازارێك لە ئەندامێکی لەش کە زانستی پزیشکی مرۆڤ دەستە وەستان بووە لە چارەسەر کردنی.

## چارەسەر کردنی:

چارەسەر کردنی ئەم جۆرە لە هێزی نەفسیەتی ئەم کەسە دەبێت ڕاستگۆبێت لە ڕووکردنە خوا، وە خۆپاراستن و خۆپەناگرتنە دروستەکان و ئەوەی بەدڵ و بەزمان ئەنجام دەدرێت، هەروەها لەلایەن ئەو کەسەوەی کە چارەسەری دەکات، دەبێ ئارا بێت،وەچاکتروایە کەزانابێت بە ئەحواڵی

جنۆکــه و شــەیتانەکان، زانــابێت بــەرێگاکانی چوونــه ژوورەوەی جنۆکه بۆ لەشی مرۆڤ، سەیربکه شێخی ئیسلام (إبن تیمیة) (رحمه الله): (کاتێك جنۆکەکه پـێی ووت من لەبەر خاتری تۆ و لەبەر رێزگرتنم لەتۆ دەردەچم، ئەویش پـێی ووت : نــەخێر بــەڵکو لەبــەر گوێڕایــەڵی خــودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەربچۆ).

(إبــن القیــم) دەفــەرمووێ: (شــێخمان (واتــه: إبــن تیمیة)چەندین جار ئەم ئایەتەی لەگوێی پەرکەمدارەکـه دەخوێندەوه ﴿أفحسبتم أنما خلقنا عبثا وأنكم إلينا لا ترجعون﴾ (المؤمنون: ١١٥).

هــەروەها چارەســەری دەکــرد بــه ئایــەتی (کورســی)، وەفــەرمانی دەدا بــەوەی تووشــی پەرکــەم بــووه و ئــەوەی چارەســەری دەکـات زۆر ئایـەتی (کورســی) بخوێنێــت، وه خوێندنەوەی سورەتی (الفلق) و (الناس).

وه ئەگـەر جنۆکەکه، یـاخی بـوو بـوو وه دەرنـەدەهات ئەوا به لێدان دەردەهێندرێن.

## چەند نیشانەیەك بۆ زانینی ئامادە بوونی جنۆکە :

چاو داخستن یان ئەبڵەق بوون یان دانانی دەست لەسەر هەردوو چاو، لەرزێك لەهەموو لایەکانی لەش، هاوار و قیژە، ناو هێنانی جنۆکەکە.

## دوای چارەسەر کردنەکە :

کە قۆناغێکی ناخۆش و قورسە، چونکە مرۆڤەکە لەژێر هەرەشەی دووبارە چوونەوەی جنۆکە بۆ لەشیەتی، بۆیە پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە بۆلای خودا وە پارێزگاری بکات لەنوێژەکانی بەجەماعەت؛ وەیادی خودا زۆر بکات وە زۆر گوێبیستی قورئان بێت و بیخوێنێتەوە وەناوی خوا بهێنێت لەهەموو شتێکدا.

# چارەسەر کردنی نەخۆشیە دەروونیەکان

ئەمانە چەند هۆکارێك و وەسیلەیەکن بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشیە دەرونیەکان، وە لەگەورەترین هۆیەکانی چارەسەرکردنی دڵەڕاوکێی دەروونییە، ئەگەر بیری لێ بکەیتەوە و کاری پێ بکەی بەڕاستگۆی و دڵسۆزیەوە وە هەندێ لەزانایان زۆر حاڵەتی دەرونیان پێی چارەسەر کردووە، کەسوودێکی چاکی هەبووە ئەمەش هۆیەکانن بەکورتی:

١- هیدایەت و تەوحید ﴿أفمن شرح الله صدره للإسلام فهو على نور من ربه﴾ (الزمر: ٢٢).

٢- نوری ئیمان و کرداری چاك ﴿من عمل صالحاً من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة ولنجزينهم أجرهم بأحسن ما كانوا يعملون﴾ (النحل: ٩٧).

٣- گەڕانەوە بۆلای خودا، وە خۆشویستنی ئەو لەسەر هەموو خۆشەویستییەك بێت.

٤- چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی بەکردار و گوفتار.

٥- زۆر یادی خوای گەورە ﴿ألا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ (الرعد: ٢٨).

٦- زانستێکی بەسوودی وەرگیراو لەپێغەمبەر (ﷺ).

٧- نازایەتی، چونکە کەسێکی ئازا دەروون فراوان و دڵ گەورەیە.

٨- دەرکردنی پیسی لەدڵدا وەك حەسوودی و ڕق و قین و دڕایەتی[٣٣].

٩- شوێنکەوتنی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دەست نیشان کردووین کە دەفەرمووێت: ((أنظرو إلی من هو أسفل منکم ولا تنظرو إلی من هو فوقکم فإنه أجدر أن لاتزدروا نعمة الله علیکم)) واتە: (سەیری ئەوانە بکەن کەلەژێر ئێوەدان وە سەیری ئەوانە مەکەن کە لەسەروی ئێوەوەن چونکە ئەمە چاکترە بۆ ئەوەی نیعمەتەکانی خودا لەبەر چاو کەم نەبێتەوە).

١٠- دوورکەوتنەوە لەسەیرکردنە بێ سوودەکان و قسە و گوێگرتن و تێکەڵاو بوون و خواردن و نووستنە و بێ سوودەکان.

١١- پشت بەستن بەخوا و تەوەکول کردن لەسەر ئەو و خۆبەدەستەوە نەدان بۆ ئەوهام و فکر و خەیاڵاتی خراپ.

---

(٣٣) واتە: (ئەو ڕق و قینەی بەرامبەر موسڵمانان بۆ دروست بۆوە هەر لەبەر بەرژەوەی خۆی.

١٢- باس كردنی داننـان بەنیعمەتـە دیـار و شـاراوەكانی خوای گەورە.

١٣- خۆ خەریك كردن بەكار و زانستێكی بەسوودەوە.

١٤- خۆ ڕاهێنـان لەسـەر ئـەوەی كـەداوای سوپاس نەكـەی جگە لەخوا.

١٥- یەكلایی كردنەوەی كارەكان و دەست بـەتاڵ بـوون بـۆ داهاتوو.

١٦- مامەڵـەكردنی چـاك لەگـەڵ خـێزان و خـزم و هـاوڕێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((لایفرك مؤمن مؤمنـــــة إن كره منها خلقا رضي منها اخــر)) واتـه: نابێ ئیمانداریـ... رقی لەئیمانداریكی ئافرەت بێت (واتـه خیزانەكەی) گـه سیفەتێكی بەدڵ نەبوو ئەوا سیفەتێكی تـری هەیـە ... پێی ڕازییە.

١٧- بزانـی كـەوا عەزیـەت دانـی خـەڵكی بۆتـۆ بەتایبـەتی قسەی خراپ و جنێو، زیان بەتۆ ناگەیەنێ بـەڵكو زیـان بەخۆیان دەگەیەنێ.

١٨- هـەڵبژێری لـەكردەوە چاكـەكان، گرنگـترین لـە پێـش گرینگەوە بۆ ئەمەش پشت ببەستە بە ئەقڵێكی ڕاست و دروست و ڕاوێژ كردن.

١٩- بەهێز کردنی دڵ و گوێ پێ نەدان بەخەیاڵات و ئەوهام کەبیر کردنەوە لەشتی خراپ دروستی دەکات.

٢٠- هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی ناخۆشی و تاڵی بەڵاو موسیبەتەکان بەبیر نەکردنەوە لە ئیحتمالاتی خراپ وە سەبر گرتن لەسەری و دڵ ئارام بوون تیایدا.

٢١- لەبیر بردنەوەی ناخۆشیەکانی ڕابردوو.

٢٢- گرنگی دان بەکاری ئێستا و تۆزێ گرینگیدان بە کاتی داهاتوو.

٢٣- بەرز کردنەوەی ئاستی بیر کردنەوەت و هەوڵەکانت بۆ سوود پێگەیاندن لە دنیا و ئاخیرەت.

٢٤- جیهاد کردن لەپێناو خوادا، لەبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ((علیکم بالجهاد في سبیل الله، وتعالی فأنه باب من أبواب الجنة. یذهب الله به الهم والغم))[٣٤] واتە: (تێبکۆشن و جیهاد بکەن لەپێناو خودا، چونکە جیهاد کردن لەپێناو خودا، دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، کە بەهۆیەوە بەندە ڕزگاری دەبێت لەخەم و خەفەت).

٢٥- دوعا و پاڕانەوە لەخوا بۆ چاکردنی سەرجەم کارەکان و بارەکان وەك ئەم دوعایە: ((أللهم أصلح لي دیني الـذي

---

(٣٤) اخرجه حاکم وغیره السلسلة الصحیحة (١٩٤١).

هو عصمت أمري ودنياي التي فيها معاشي، وآخرتي التي إليها معادي، واجعل الحياة زيادة لي في كل خير والموت راحة لي من كل شر)) [٣٥].

هـ رواه‌ها ((اللهم رحمتك ارجوا فلا تكلني إلى نفسي طرفة عين وأصلح لي شأني كله لاإله إلا أنت)) [٣٦].

---

(٣٥) (رواه مسلم: ٣٠٨٧/٤).

(٣٦) رواه ابوداود (صحيح ابوداود (٩٥٩/٣)).

# چارەسەر کردنی نەخۆشیەکانی دڵ

* خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿يا أيها الناس قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور وهدى ورحمة للمؤمنين﴾ (يونس: ٥٧) واتـە: (ئـەی خەڵکینـە، بۆتـان هـاتووە لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە ئامۆژگـاری و شـیفا بـۆ ئەوەی لەسنگەکاندایە (دڵ) وە مایەی ڕەحمەت و هیدایەتـە بۆ ئیمانداران).

* وە پێغەمبـەر (ﷺ) زۆر ئەمـەی دووبـارە دەکـردەوە ((یامقلب القلوب ثبت قلبي على دينـك))[٢٧] بەتایبەتی لـە سوجدەکانی.. لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی ((ئەگە ر دڵ چاك بێت، سـەرجەم ئەندامـەکانی لـەش چـاك دەبـن، وە ئەگـەر دڵ تێکبچێـت ، سـەرجەم ئەندامـەکانی لـەش تێکدەچن)).

* هـەندێ لـەزانایان ووتوویانـە: دەرمـانی دڵ لـە پێنـج شت دایە: (خوێندنەوەی قورئان بەبیر لێکردنەوە؛

---

(٢٧) رواه الترمذي (٢٣٨/٥) واحمد (١٨٢/٤) والحاكم (٥٢٥/١ و ٥٢٨).

وه بـەتاڵی سك، وه هەڵسـانەوەی شـەو (قيـام الليـل)، وەپاڕانەوه لەکاتی پێش بەیانی (سحر)، وه دانیشتن لەگەڵ پیاوچاکاندا).

وەك شاعیر دەڵێت:

دواء قلبـك خمسـةٌ عنْـدَ قَسـوته
فَـدُمْ عليـها تَفُـزْ بالخـير والظَفـر
خـلاء البطـن، وقـران تُدَبِّـرُهُ
كـذا قيـامك جنـح الليـل اوسـطته
وان تجـالس أهـل الخـير والخَـبر

(إبـن القيـم) -رحمـه الله- دەفـەرمووێ: (ئەگـەر بـەندە بەیانی و ئێوارەی بەسەردا هات، هیچ خـەمێکی نـەبوو جگـە لـە ڕازی کردنـی خـوای گـەورە.. ئـەوا خـوای گـەورە هـەموو پێویستیەکانی دەگرێتە ئەستۆی خۆی، وەهەموو خـەمێکی لەسـەر لادەدات وه دڵـی ڕووه و خۆشەویستی خـۆی دەبـات، وه زمانی بەره و زیکری خۆی دەبات، وه ئەندامەکانی لەشـی بۆ خزمەتکردنی و گوێڕایەڵی خۆی دەبات وه ئەگـەر بـەیانی و ئێوارەی بەسەردا هات، تەنها دنیا خەمی بوو خوای گەوره هـەموو خـەم و خەفـەت و ناخۆشـیەکان دەخاتـە سـەری وەئەیسـپێرێ بەنەفسـی خـۆی، وه دڵـی سـەرقاڵ دەبێـت

لەخۆشەویستی ئەو بەخۆشەویستی خەڵك؛ وە زمانی لەزیکری ئەو بەزیکری خەڵکی وە ئەندامەکانی لەشی لەگوێڕایەڵی ئەو بەگوێڕایەڵی خەڵکی و خزمەتکردنیان).

بۆیە هەرکەسێ پشت هەڵکات لە پەرستن و بەندایەتی کردنی بۆ پەروەردگار تاقی دەکرێتەوە بە بەندایەتی کردن و پەرستنی بەندە و خۆشویستنی، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ومن يعش عن ذكر الرحمن نقيض له شيطاناً فهو له قرين﴾ (الزخرف: ٣٦).

واتە: (هەرکەسێ دوور کەوێتەوە لەزیکر و یادی ڕەحمان ئەوا شەیتانێکی بۆ تەرخان دەکەین بەردەوام لەگەڵی دابێت کە لایبدات لەڕێگەی ڕاست و بەرە و دۆزەخی ببات.

هەروەها دەفەرمووێ: (لەم سێ شوێنە هەوڵدە و بزانە دڵ هەیە: ١- لەکاتی بیستنی قورئان. ٢- لەکۆڕ و کۆبوونەوەی یاد و زیکر. ٣- وەلەکاتی تەنیایی و خەڵوەت).

ئەگەر لەم شوێنانە دڵت نەدۆزیەوە، ئەوا داوا لەخودا بکە کە دڵێکت پێ ببەخشێ چونکە تۆ دڵت نییە.

# هەندێ جۆر لە چارەسەری

## ١- چارەسەرکردنی بەڵاو خەم و ناخۆشی:

* پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی بەڵاو موسیبەتدا دەیفەرموو: ((لاإله إلا الله العظيم الحليم، لاإلـــه إلا الله رب العـــرش العظيم، لاإله إلا الله رب السماوات والأرض ورب العرش الكريم))[٣٨].

* هەروەها ((لاإله إلا أنت سبحانك إني كنـــت مـــن الظـــالمين)) ئەم دوعايە هيچ موسڵمانێك نەيخوێندوە ئيلا خواى گەورە، بەهانايەوە هاتووە لەكاتى بەڵاو ناخۆشى دا.

* وە ((لاحـــول ولاقـــوة إلا بـــالله)) دەرمانى (٩٩) نەخۆشـــيە ســـوكترينيان خەمـــە. وەلەڕيوايـــەتێكى تـــردا ((گەنجينەيەكە لەگەنجينەكانى بەهەشت))[٣٩].

* ئەگەر بەيانى يان ئێوارە هات بەسەرتا بڵێ: ((اللـــهم إني أعوذ بك من الهم والحزن وأعوذ بك من غلبة الديـــن وقهر الرجال)).

---

(٣٨) رواه البخاري (٦٣٤٥) ومسلم (٢٧٣٠).

(٣٩) رواه البخاري (١٦٩/٧) ومسلم (٢٧/١٧).

## ٢- چارەسەر کردنی سەرئێشە :

پێغەمبەر (ﷺ)لەنەخۆش کەوتنی مردنەکەی دەیفەرموو: ((ئای سەرم !)) وەسەری دەبەست لەکاتی نەخۆشیەکەیدا، سەربەستن سوودی هەیە بۆ سەرئێشەی (شقیقة) و هەندێ جۆری تری سەرئێشە.

## ٣- چارەسەری ( عرق النسا ) :

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((دواء عرق النسا الية شاةٍ أعرابية تذاب ثم تجزأ ثلاثة اجزاء ثم وشرب على الريق في كل يوم جزء)) [٤٠] واتە: (دەرمانی (عرق النسا) ئەوەیە، دوگی بەرانێك بتوێندرێتەوە پاشان بکرێت بەسێ بەشەوە، پاشان لە پێش خواردنی هیچ شتێك بخورێتەوە لەهەر ڕۆژێك و بەشێك).

(عرق النسا) ئازارێکە دەست پێدەکات لە (مفصل)ی دواوەی مرۆڤ وەلە پێشەوە دێتە خوارێ تاسەر ڕان وە قاچ و ڕان لەگەڵیدا باریك و لاواز دەبن،وە هەندێ جار لەناکاو دروست دەبێت و هەندێ جار بەتەدریجی.

---

(٤٠) واخرجه احمد والحاكم في صحيحه.

## ٤- چارەسەرکردنی ئـەوەی زامێك یـان برینێکـی لەگەڵە:

پەنجەی شایەتمانی لەزەوی دەدات و بەرزی دەکاتەوەو دەڵێت: ((بسم الله تربة ارضا بريقة بعضنا، يُشفى سـقيمنا بإذن ربنا))[٤١].

## ٥- چارەسەرکردنی نەخۆشی و دڵتەنگی:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((التلبينـة مجمـة لفـؤاد المريض, تذهبُ بعضَ الحزن))[٤٢].

وە (التلبينة) شۆربایەکە کەلەماست و هەنگوین دروست دەکرێت.

* وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر خزم و کەسی گرێ گ... ر... عەزیـەتی بدانایـە، فـەرمانی دەدا شـلەیەك دروسـت بـکـ...ن پاشان فەرمانی دەدا کەبیخۆن.

* وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرموێ: ((هەرکەسێ سـەردانی نەخۆشـێك بکـات کەئەجـەلی نـەهاتبێت، لـەلای دا،

---

(٤١) البخاري مع الفتح ٢٠٦/١٠، ومسلم ١٧٢٤/٤ برقم (٢١٩٤).

(٤٢) صحيح مسلم رقم (٢٢١٦) باب: التلبينة مجمة لفؤاد المريض.

(حەوت جار) بلێت ((أسل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك))[٤٣] ئیلا خوای گەورە شیفای دەدات؟

## ٦- چارەسەری ترسان و نەخەوتن:

* کاتێك دەچیتە سەر جێگەی خەوتنت بلێ ((اللهم رب السموات السبع وما أظلت, ورب الارضين وما اقلت. ورب الشياطين وما أظلت كن لي جاراً من شر خلقك كلهم جميعاً أن يفرط علي أحد منهم، أو يغي علي، عزجارك وجل ثناؤك ولا إله غيرك ولا إله إلا أنت))[٤٤].

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە لەناکاو لەخەو خەبەری بویەوە بابلێت: ((أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه وشر عباده ومن همزات الشياطين وان يحضرون))[٤٥].

---

(٤٣) رواه الترمزي صحيح الترمزي (٣/٢١٠).

(٤٤) رواه مسلم.

(٤٥) ابوداود ٤/١٢وانظر صحيح الترمزي ٣/١٧١ وهو حديث حسن.

## ٧- چارەسەر كردنی پێوەدانی مار و دووپشك:

* لەسەر نەخۆشەكە سورەتی (الفاتحة) دەخوێندرێتەوە وە دووبارەی دەكاتەوە، وەك چۆن یەكێك لە (سەحابەكان) ئەمەی كرد بۆ یەكێ لەگەورەی قەومێك لە عەرەب و چاك بویەوە، وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم كارەی بەچاك زانی[٤٦].

## ٨- چارەسەری تا (الحمى):

* پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((الحمى من فيح جهنم فابردوها بالماء))[٤٧] واتە: ((تا) لە گڕی دۆزەخە ساردی بكەنەوە بە ئاو).

## ٩- چارەسەری چاو و شیفا بوونی:

* پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((الكمأةُ من المن وماؤها شفاء للعين))[٤٨] واتە: (دۆمەلآن لە (المَنَّ) وە ئاوەكەی شیفایە بۆ چاو).

---

(٤٦) تەخریج كراوە.

(٤٧) البخاري مع الفتح ١٠/٢٠٨.

(٤٨) اخرجاه في الصحيحين.

## ١٠- چارەسەری ئێش و ئازار:

دەستت دابنێ لەسەر ئەو شوێنەی لەشت کە ئێشەکەی تیایە و بڵێ (بسم الله) سێ جار وەبڵێ ((أعوذ بالله وقدرته من شر ماأجد واحاذر)) (حەوت جار)[٤٩]

## ١١- چارەسەر کردنی تووڕەیی:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وأما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله إنه هو السميع العليم﴾ (فصلت: ٣٦).

واتە: (بڵێ: اعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

* وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((.... فإذا غضب أحدكم فليتوضأ))[٥٠] واتە: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە تووڕە بوو بادەست نوێژ بگرێ).

* وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بەو کەسەی تووڕەدەبێت: ((إذا كان قائماً فليجلس وإذا كان جالساً فليضطجع))[٥١] واتە: (ئەگەر بەپێوە بور بادابنیشێت وە ئەگەر دانیشتبوو با پاڵکەوێت).

---

(٤٩) رواه مسلم ٤/ ١٧٢٨.

(٥٠) رواه ابوداود (٤٧٨٤).

(٥١) رواه ابوداود (٤٧٨٣).

## ١٢- چارەسەر کردنی قورسی و ئەستەمی منالّ بوون :

* ئیمام أحمد بن حنبل (رحمه الله) لە جامێکی سپیدا یان شتێکی پاکدا دەینووسی (لاإله إلا الله الحليم الكريم سبحان الله رب العرش العظيم، الحمد لله رب العالمين ﴿كأنهم يوم يرونها لم يلبثوا إلا ساعة من نهار بلاغ﴾ (الأحقاف: ٣٥)، ﴿كأنهم يرونها لم يلبثوا إلا عشية أو ضحاها﴾ النازعات: ٤٦) بەزەعفەران وە دەیشۆرد بەئاو وە ئاوەکە دەدات بە ئافرەتەکە وە هەندێکیشی دەرشاند بەسەر سکی ئافرەتەکەدا.

## ١٣- چارەسەری خوێن هاتن لە لووت ( الرعاف ) :

*. شێخی ئیسلام (إبن تيمية الحراني) (رحمه الله) لەسەر ناوچەوانی نەخۆشەکە دەینووسی ﴿وقيل يا أرض ابلعي ماءك ويا سماء أقلعي وغيض الماء وقضي الأمر﴾ (هود: ٤٤).

وە بیستم دەیفەرموو: (واتە ابن القيم بیستوویەتی).

ئەمەم بۆ چەند کەسێك نووسیوە و چاك بۆتەوە وە دەیفەرموو، نابێ بەخوێنەکەی لووتی بنووسرێت وەك جاهیلەکان دەیکەن).

## ١٤- چارەسەری دان ئێشە :

دەنوسرێت لەسەر ئەولا ڕوومەتەی کەئازارەکەی لێ نزیکە: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم: قل هو الذي أنشأكم وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلا ما تشكرون﴾ (الملك: ٢٣).

وەئەگەر حەزی کرد دەینوسێت ﴿وله ما سكن في الليل والنهار وهو السميع العليم﴾ (الأنعام: ١٣)[٥٢].

* هەروەها (الدار قطني) ڕیوایەتی‌کردووە بەسەنەدی خۆی لە (إبن عباس) کەفەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من اشتكى ضرسه فليضع اصبعه عليه وليقرأ ﴿وهو الذي أنشأكم من نفس واحدة فمستقر ومستودع قد فصلنا الآيات لقوم يفقهون﴾ (الأنعام: ٩٨) ).

---

(٥٢)(الطب النبوي ص ٣٥٩ لأبن القيم).

## ١٥- چارەسەر کردنی دەرکەوتنی پەڵەی سپی لەسەر لەش:

سورەتی (الفاتحة) (حەوت جار) دەخوێندرێتەوە بەسەر ڕۆنی زەیتوون وە شوێنە بەرکەوتووەکەی پێ چەوردەکرێت بۆ ماوەی مانگێك چاك دەبێتەوە (إنشاء الله) (تاقی کردنەوەیەکی سەرکەوتووی یەکێ لە پیاوچاکانە).

## ١٦- چارەسەر کردنی موصیبەت:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((مامن عبد تصيبه مصيبة فيقول: إنا لله وإنا إليه راجعون اللهم اجرني في مصيبتي واخلف لي خيراً منها إلا اجره الله في مصيبته واخلف له خيراً منها))[٥٣].

واتە: (هەر بەندەیەك تووشی موسیبەتێك بێت و بڵێت: (إنا لله وإنا إليه راجعون) خوایە ئەم موسیبەتەم بەپاداشت بۆ دابنێ وە لەمەم چاکتر بۆ بهێنی، ئیلا خوای گەورە بەپاداشت بۆی دەنووسێت و حاڵی چاکتر دەکات).

---

(٥٣) رواه مسلم (٦٣٢/١).

* خــوای گــەورە دەفــەرمووێ (لەفەرموودەیــەکی قودسیدا): ﴿إذا أبتليت عبدي بحبيبته فصبر واحتسب عوضته منهما الجنة﴾

واتــە: (ئەگــەر بەندەکــەم تــاقی بکەمــەوە بــەدوو خۆشەویستەکەی (واتە: دوو چاوەکەی کوێر بکەم) ئەویش سەبر بگرێ و چاوەڕێی پاداشت بکات ئەوا قەرەبووی دەکەمەوە بەبەهەشت).

## ١٧- چارەسەری نەخۆشی قورگ:[٥٤].

ئیمام (البیهقي) ریوایەتی کردووە لە (شعب الایمان) لە (واثلة بن الاسقع) کەوا پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کەگلەیی ئێشانی قورگی لەلاکرد. پێغەمبەر(ﷺ) پـێی فەرموو ((علیك بقرأة القرآن)) [٥٥].

واتـە: قورئـان بخوێنـە قورئـان زۆر خوێنـدن ئـارامیو رەحمەت دەخاتە سەردڵ و دەروون و والە ئەندامەکان دەکات بەچاکترین شێوەکار بکەن (بەئیزنی خودا).

---

(٥٤) لەژمارە (١٧–٢٠) لەزیاد کردنی خۆمە هەربۆ سود وەرگرتن (وەرگێڕ).

(٥٥) رواه البیهقی في شعب الایمان (٢/٥١٩).

## ١٨- چارەسەری کۆڵنج (قولنج).

ئـەم نەخۆشـیـیە زۆر بـەربڵاوە لـەنێوان خـەڵکی .. هۆیـەکانی هـەندێکی دەروونـین، هـەندێکی ئـەندامین (عضوي)ن وە هەندێکی خۆراکین (غذائي)

تائێستا زانستی پزیشکی نەگەیشتۆتە چارەسەرێکی ریشەی بۆ ئەم نەخۆشییە. تەنها چەند هێمنکەرەوەیەکی بۆ دیاری کردووە (مسکنات) وەك (کاسباز موکینلس- سازمو سیبالجین) بـەڵام لەپزیشکی ئیسلامی چارەسـەرێکی بـۆ دۆزراوەتەوە کەتەواو چارەسەری دەکات. بەڵام دەبێ بزانین هۆیـەکانی دروسـت بوونـی کۆڵنـج. تـوورە بـوون و ماندوو بوون و خواردنـی بـەهاراتی تیـژو خواردنـەوەی غازییەکان (المشروبات الغازية)ە.

### چارەسەری کۆڵنج بەقورئان.

سـورەتی (فاتیحـە) دەنووسـرێت تـا ﴿ولا الضـالين﴾ هـەروەها سورەتی (الاخـلاص) و (المعوذتـين) دەنووسـرێت پاشان دەنووسـرێت (اعـوذ بوجـه الله العظيـم وبعزتـه التـى لاترام وقدرته التى لايمتنع شيء من شر هذا الوجه ومن شر مافيـه) (نووسـینەکە بەزەعفـەران و نـاوی گـوڵ لەسـەر

شوشـەیەك یـان سـینیەكی بـێ نـەخش دەنووسـرێت پـاش ئەوەی ووشك دەبێتەوە بەئاوی زمزم یان باران لادەبرێت).

## ١٩- چارەسەری ڕۆماتیزم

دەستی ڕاستت لەسەر شوێنی ئازارەكەدا دابنێ و سێ جار ئەم ئایەتە بخوێنە،كەخوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وما كان لنفس ان تموت الا بأذن الله كتاباً مؤجلاً ومن يرد ثواب الدنيا نؤته منها ومن يرد ثواب الاخرة نؤته منها وسنجزي الشاكرين﴾. (ال عمـران: ١٤٥). وە (حـەوت جـار) سـوورەتی (القـدر) بخوێنە.

یان ئەم ئایەتە دەخوێنی كەخوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿اولم ير الذين كفروا ان السموات والارض كانتا رتقا ففتقناهما وجعلنا من الماء كل شيء حي﴾ (الانبياء: ٣٠).

## ٢٠- چارەسەری ئازاری میزڵدان

ئەم ئایەتە بخوێنەوە و دەستت لەسەر شوێنی ئازارەكە دابنێ ﴿الم تعلم ان الله له ملك السموات والارض وما لكم من دون الله من ولي ولا نصير﴾ (البقرة: ١٠٧) (سێ جار).

## ٢١- چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجە ( السرطان )

برایەك لەووڵاتی سعودیا ئەم تاقی کردنەوەی ئەنجام داوە لەسەر (١١٨) کەسی تووش بوو بەنەخۆشی شێرپەنجە بەهەموو جۆرەکانی وەك شێرپەنجەی خوێن یان مەمك یان ڕەحم یان گەدە یان بۆری هەناسە، بەفەزڵی خوای گەورە هەر هەموویان چاك بوونەوە بە تەواوەتی.

چارەسەریەکەشی بەم شێوەیە:

١- سورەتی (الفاتحە) دەخوێندرێت.

٢- (٥) ئایەتی سەرەتای سورەتی (البقرة).

٣- ئایەتی (١٦٤، ١٦٥) لەسورەتی (البقرة).

٤- ئایەتی (کورسی) و دووئایەتی دوای خۆی.

٥- ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (البقرة).

٦- پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (ال عمران).

٧- ئایەتی (١٨) لەسورەتی (ال عمران).

٨- ئایەتی (٢٦، ٢٧) لە (ال عمران).

٩- ئایەتەکانی (٥٤، ٥٥، ٥٦) لەسورەتی (الأعراف).

١٠- ئایەتەکانی (١١٧، ١١٨، ١١٩) لەسورەتی (الأعراف).

١١- ئایەتەکانی (٨٠، ٨١، ٨٢) لەسورەتی (یونس).

١٢- ئایەتی (٦٥ — ٦٩) لەسورەتی (طه).

١٣- ئایەتی (١١٥ — ١١٨) لەسورەتی (المؤمنون).

١٤- ئایەتی (٢١ — ٢٤) لەسورەتی (الحشر).

١٥- (١٥) ئایەتی سەرەتای سورەتی (الصافات).

١٦- ئایەتی (٣١ — ٣٣) لەسورەتی (الرحمن).

١٧- ئایەتی (٣، ٤) لەسورەتی (تبارك).

١٨- ئایەتی (٥١، ٥٢) لەسورەتی (القلم).

١٩- ئایەتی (٣) لەسورەتی (الجن).

٢٠- سورەتی (الكافرون).

٢١- سورەتی (الفلق).

٢٢- سورەتی (الناس).

## چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە :

١- ئەم ئایەتانە (حەوت جار) دەخوێندرێت لەسەر بڕێك ئاو كەبەشی خۆپێ شۆردنێك بكات، ڕۆژی یەك جار بۆماوەی هەفتەیەك.

٢- ئەم ئایەتانە دەخوێندرێت لەسەر بڕێك زەیتی زەیتون كەبەشی چەوركردنی شوێنە تووش بووەكە بكات بۆماوەی (٢١) بیست و یەك ڕۆژ.

**لـەدوای خوێندنـەوەی ئـەم ئایەتانـە لەسـەر ئـاو و زەیتەکە ئەم دووعایانەش بەسەریدا دەخوێندرێت.**

* ((اللهم رب الناس أذهب البأس، اشف وأنت الشافي لاشفاء الا شفاءك، شفاء لايغادر سقماً)) **(حەوت جار).**

* ((أسال الله العظيم ان يشفيك)) **(حەوت جار).**

* ((أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه ومن شر عباده ومن همزات الشياطين وان يحضرون)) **(سێ جار).**

* ((بسم الله الشافي اللهم اشف عبدك و صدق رسولك (ﷺ))).

*** لەدوای خوێندنـەوەی ئـەم ئایـەت و دوعایانـە بـەو ژمـارەی دیاری کرا لەسەر ئاو و زەیتەکە.**

**ڕۆژانـە خـۆی پـێ دەشـۆرێت، وەخواردنـەوەی ئاوەکـە پەرداخێك بەیانیان و پەرداخێك نیوەڕۆ، وەپەرداخێك شەوان لەگەڵ چەورکردنی ئەندامە تووش بووەکە بەزەیتەکە، ئەگەر نەخۆشیەکە لەناو خوێندا بوو، ئەوا بڕبڕەی پشت و قاچی ڕاست و چەپ چەوردەکرێت، وەئەگەر لەشوێنی تربوو وەك مـەمك و ڕەحـم و گـەدە و بـۆری هەناسـە، ئـەوا لـەدیوی دەرەوەی چەوردەکرێت.**

**خۆ شۆردنکە بـۆ مـاوەی (٢١) ڕۆژ دوبـارە دەکرێتـەوە لەگـەڵ چـەورکردن بەزەیتەکـە، وەئـەم ئایـەت و دوعایانـە**

هەفتەی جارێك دووبارە دەكرێتەوە، ئینجا چاك دەبێتەوە بەئیزنی خودا[٥٦].

## هەندێ ئامۆژگاری بەسوود لە چارەسەركردن دا

* (ئیمامی شافیعی) دەفەرمووێ: ( چوار شت لە ئەقڵ زیاد دەكەن، وازهێنان لەقسەی بێسوود و زیاد، وەسیواك كردن، وەدانیشتن لەكۆڕی پیاو چاكاندا، وە دانیشتن لە كۆڕی زانایاندا).

* (إبن القیم) دەفەرمووێ:

چوار شت لەش نەخۆش دەكات: (زۆر قسەكردن، وە زۆر خەوتن، وە زۆر خواردن، وە زۆر جووت بوون).

وە چوار شت لەش تێك دەدەن: (خەم، دڵتەنگی، برسیەتی، وە شەونوخونی).

---

(٥٦) ئەم زیادكراوانە. چارەسەری شێرپەنجە وەلە (عالج نفسك بالقرآن) وەرم گرتووە.

وە چوار شت ڕوو ووشك دەكات و گەشاوەكەی دەبات (درۆكردن، وە بێ ئابڕوویی، وەزۆر پرسیار كردن لەغەیری عیلم، وە زۆر تاوانكاری).

وە چوار شت ڕوو گەش و ڕۆشن دەكەن: (پیاوەتی، وەفایی، ڕێز گرتن، لەخوا ترسان).

وە چوار شت ڕزق دەهێنن: (هەڵسانەوەی شەوان (قیام اللیل) وە زۆر داواكردنی لێخۆش بوون لەكاتی سحوردا، وە ڕاهاتن لەسەر خێر كردن، وە یاد و زیكر كردن لەسەرەتای ڕۆژگار و كۆتاییەكەی).

وە چوار شت ڕۆزی دوور دەخەنەوە: (خەوتنی دوای نوێژی بەیانی، وەكەم نوێژی، وە تەمەڵی، وەخیانەت كردن).

وە چوار شت زیان دەگەیەنێ بەبیروهۆش: (بەردەوام بوون لەسەر خواردنی شتی ترش و میوە، وە خەوتن لەسەر پشت، وە خەم و خەفەت).

* پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((لولا أن أشق علی أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة))[57]

---

(٥٧) رواه البخاري ومسلم والترمذي وابوداود والدارمي.

واته: (ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، ئەوا فەرمانم دەدا پێیان (واتە: بەشێوەی واجبی) کە سیواك بەکار بهێنن لەگەڵ هەموو نوێژێك دا).

لە سیواکدا چەندین سوود هەیە: (دەم بۆن خۆش دەکات، وە پووك بەهێز دەکات، وە بەڵغەم ناهێڵێ، وە چاو بەهێز دەکات، وە گەدە دەپارێزێ، وە دەنگ ساف دەکات، وە یارمەتی هەرس کردنی خواردەمەنی دەدات، وە قسەکردن ئاسان دەکات، چالاکی دەکات بۆ خوێندنەوە و زیکر و نوێژ کردن، وە خەوتن دەردەکات، وەخودا ڕازی دەکات، وە مەلائیکەت پێیان خۆشە وەچاکەکان زیاد دەکات).

* هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((إنَّ لله حقاً على كل مسلم أن يغتسل في كل سبعة أيام، وإن كان له طيب أن يمس منه)) واتە: (حەقی خوای گەورەیە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە حەوت ڕۆژ جارێك خۆی بشوات وە ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو بەکاری بهێنێ).

وە بۆنی خۆش چەند تایبەتمەندیەکی تیایە لەوانە: (مەلائیکەت پێی خۆشە، وە شەیتانەکان لێی دوور دەکەونەوە، وە سوودی هەیە بۆ مێشك و دڵ، وە نەفس خۆش دەکات و ڕۆح شاد دەکات).

# چارەسەر کردن بەخواردنەوەی هەنگوین

# وە کەڵەشاخ کردن و داخکردن

* پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((الشـــفاء في ثـــلاث، شربة عسل، وشرطه محجم، وكية نار، وآنا أنهى أمتي عـــن الكي))[٥٨] واتە: (شیفا لەسێ شت دایە، خواردنی هەنگوین، کەڵەشاخ کـردن، داخ کـردن، وەمـن نـەهی لـە ئوممەتەکـەم دەکەم داخ کردنەکە بەکار بهێنن).

* وە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ لـەبارەی سـوودەکانی هەنگوین: ﴿يخرج من بطونها شراب مختلف ألوانه فيه شفاء للناس إن في ذالك لأية لقوم يتفكرون﴾ (النحـل: ٦٩) واتە: (خـوای گـەورە دەردەهێنـێ لەسکیان خواردنەوەیـەکی هەمـەڕەنگ کـە شیفای تیایە بۆ خەڵکی بەڕاستی ئەمە بەڵگە و نیشانەیە بۆ ئـەوەی خـەڵکی لێبکۆڵنـەوە و گـەورەی خودایـان بـۆ دەرکەوێت.

(٥٨) اخرجه ابن ماجه واحمد والبزار.

* وە لە (صحيحين) هاتووە، إن النبي (ﷺ) ((احتجم واعطى الحجام اجره))[59] واتە: ((پێغەمبەر (ﷺ) حیجامەی کرد و کرێیەکەشی دابەوەی حیجامەکەی بۆ کرد).

* وە هەر لە (الصحيحين) هاتووە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خير ما تداويتم به الحجامة))[60] واتە: (چاکترین شت وەکو چارەسەر بەکاری بهێنن حیجامەیە).

* بەڵام هەرچی داغ کردنە وەك لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە ((وما أحب أن أكتوي)) واتە: (وەحەز ناکەم داغ کردن وەکو چارەسەر بەکار بهێنم).

ئەمەش ئاماژە کردنە بۆ دوا خستنی تا ناچار دەبیت بەکاری بهێنی وە پەلەنەکەی لەبەکار هێنانی لەبەر ئەو ئازارە زۆرەی تیایەتی بۆ لادانی ئازارێك کە لەوانەیە زۆر لەئازاری داغ کردنەکە کەم تربێت).

---

(٥٩) ابو داود والترمذي وابن ماجه.

(٦٠) في صحيحين.

## چارەسەر کردن بە ڕەشکە (الحبة السوداء)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((علیكم بهذه الحبة السوداء فأن فیها شفاء من كل داء الا السام))[61] واتە: (ئەم ڕەشکەیە بەکار بهێنن چونکە شیفایە بۆ هەموو نەخۆشیەك جگە لەمردن).

جائەم ڕەشکەیە، سوودی یەکجار زۆرە.

## چارەسەر کردن بەئاوی زمزم

گەورەی ئاوەکان و بەڕێز ترینیان و پایەدار ترینیانە، وە خۆشەویسترینیان لەلای دڵەکان، هاتووە لە (الصحیح) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەوا بە (ابي ذر)ی فەرمووە: ((هیچ خواردنێکی نەبووە جگە لە ئاوی زمزم، پێی فەرمووە ئەوە خواردنە و دەخورێت)). وە غەیری (موسلم) ئەمەیان بۆ زیاد کردووە (وەدەرمانی دەردەکانە)[62].

---

(٦١) اخرجه الترمذي واحمد وابن حبان واخرجه ایضا البخاري.

(٦٢) اخرجه مسلم.

وەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((ماء زمزم لما شـــرب لە))[٦٣] واتە: (ئاوی زمزم بەکەڵکە بۆ ئەو مەبەستەی کە بۆی دەخورێتەوە).

وە عائیشـە (خـوای لێ ڕازی بێـت) ڕیوایـەتی کـردووە: (کـەئاوی زمزمـی لەشوشـەکاندا هـەڵدەگرت، وەدەیفـەرموو: پێغەمبـەریش (ﷺ) هـــەڵیدەگرت و دەیـــدا بەنەخۆشـــەکان بیخۆن و پیای دەکردن)[٦٤].

---

(٦٣) ابن ماجه: المناسك، باب الشرب من زمزم (١٠١٨/٢).

(٦٤) اخبار مكة للفاكهي (٤٩/٢) سنن البيهقي (٢٠٢/٥) وحسنه السخاوي في المقاصد الحسنة (ص ٣٦٠).

# پێڕست

وە هەرچی ((تعلموا السحر ولاتعملوا به)) هەر فەرموودە نییە نەڕاستە و نەلاواز ئەوەی بزانین.

(وصلى الله على نبينا محمد واله وصحبه وسلم).

پ ٤/ ئایا دروستە بۆ موسڵمان بەهەر جۆرە ڕوقیەیەك چارەسەری خۆی بکات؟

وەڵام: دروستە ئەو ڕوقیەیەی کە شیرکی تیانییە وەك سورەتەکانی قورئان و ئایەتەکان و وەك ئەو زیکرانەی لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە، وەحەرام دەبێت ئەگەر شیرك و پەنا گرتنی نەخۆشەکەی تیا بێت بەهاواربردن بۆناوی جنۆکەکان و پیاو چاکان هەروەها گەر ماناکەی نەزانرێت نەوەك شیرك بێت لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) (لابأس بالرقى مالم تكن شركاً)[٦٦] واتە: (ڕوقیە هیچی تیا نییە ئەگەر شیرکی تیا نەبوو).

(تم بحمد الله)

---

(٦٦) صحيح مسلم.